# پێناسەی کتێب

ناوی کتێب: ڕەشماڵی خەم

نوسەر: گەردین بەرزێوەیی

بابەت: شعر

پیت چنین:دیار رواندزی

نەخشەسازی : سامی فەتاح سادق

بەرگ : کاکە گەلاڵەیی

هەڵەگری:محمد خۆشکانی

سالی چاپ: ۲۰۰۸ هەولێر – چاپی یەکەم

مۆنتیف: دڵشاد محمد عەبدی

چاپ : چاپخانەی ماردین

تیراژ: ۱۰۰۰

# پێشکەشە بە:

- هەموو ئەو کەسانەی شیعرە کانم دەخوێنەوە
- بە هاوسەری ژیانم (سەنیعە کەلاڵەیی)
- بە هەموو ئەو چاوانەی کە فرمێسکی خۆشەویستیان بۆ عەشق ڕشتوە
- ڕوبار ڕواندزی

# هەناسەیەکی حەسانەوە
# لە ژێر ( رەشماڵی خەم ) دا

( رەشماڵی خەم ) بەرچنە گوڵە هونراوەیەکی بۆن خۆشە لە نێو گوڵزاری هۆنراوەکانی ( گەردین بەرزێوەیی ) داو دەمێکە هەڵبەست دۆستان پێی ئاشنا بوون و بە بۆن و بەرامەی ئەو گوڵە هۆنراوانە خۆیان سەرمەست کردووە.. منیش وەك هەر خوێنەرێك لە خوێنەرانی هۆنراوەی کوردی حەیامێکە بەودیو پەرژینی گوڵزاری هۆنراوەکانی ( گەردین ) دا لە ئامێزی چەند پیاسەیەکی تەنیایدا دێم و دەچم و نیگای چاوەکانی ئارەزووم کەوتۆتە سەر ئەو گوڵزارە رەنگینە.

ئەز هەر بەدیتنی ئەو گوڵە هۆنراوانە تێنوەتی دەرونم نەشکاو دڵم ئاوی نەخواردەوە، بەڵکو بۆنی خۆشی ئەو گوڵە هۆنراوانە وای لێکردم پەرژینی گوڵنەخشینی ئەو گوڵزارە بشکێنم و بە بەرامەی دڵرفێندا خۆم مەست بکەم.

جوانە وابڵێم کە هەر من نیم لە گوڵزاری هۆنراوەکانی ئەم هەڵبەستیارە لاوە ورد بوومەتەوەو بەرامەی خۆشی گوڵە هۆنراوەکان پڕاوەتە ناخم.. چونکە خوێنەرگەلێك هەن شەیدای ئەو گوڵە هۆنراوانەن و دڵدارگەلیکیش هەن لەوەرزی بوهاری ئەڤینداریدا بە زەردەخەنەی خۆشیەوە گوڵە هۆنراوەکان لە بەرۆکی حەزەکانی خۆیان ئەدەن.

هەستێکی ناسکی باڵ تەنك وەك باڵی پەپولە کانیاوی سازگاری هۆنراوەکانی ( گەردین ) یان تەقاندۆتەوە.. هەر ئەو هەستە ناسکە باڵ پەپولەییەشە ئاوێزانی سۆزی گەرم و گوڕی دڵی دەبێت و شەو بێدارانە دەست دەکاتە گەردنی فریشتەی موژدە هێنی ئیلهام و گەردانەی هەڵبەست دەهۆنێتەوە.

جوانتریشە ئەوە بڵێم کە ( گەردین ) بەدەر لەوەی گەنجێکی نیگا جوان و هەست ناسکە هۆنیارێکی نیگا جوانترو هەست ناسکتریشە.. گەر لە کورتە پیاسەیەکی

ئێوارانەی ئەشنە بەخشدا بە نیگایەکی سەوز و عاتیفەیەکی نەرم و نیان لە باخچەی ئەوگوڵە هۆنراوانە رامینین دەتوانین چەپك چەپك گوڵە هۆنراوەکان دەسکەنە بکەین و بیانخەینە نێو گوڵدانی جوانیەکان و بەردەم پەنجەرەی روانینی هەڵبەست دۆستان و ئەویندارانی شیعری پێ برازێنینەوە.. کاتێکیش بمانەوێ هەناسەیەکی حەسانەوە لە ژێر سێبەری ( رەشماڵی خەم ) دا هەڵمژین، مایەی جوانیە بە پەرداخی نێو دەستی هەستمان قوم قوم ئاوی جۆگەلەی سازگاری هۆنراوەکان بخۆینەوە و چیمەنی رۆحمان تێر ئاو بکەین، ئەوجا بۆمان دیار دەبێ کانیاوی هۆنراوەکان لە دامێنی زۆزانی هەوارگەی چ ئەوینێکی پاك و بێگەرد هەڵقوڵاوە.. ئەوینێك تێکەڵ بە جریوەی ئەستێرە زیوینەکانی شەوانی سامالی هاوین ، هاو رەنگ لە گەڵ پشکۆی دەم ئاگردانی شەوانی زستان، هاوسۆز لە گەڵ تریەی ئاوازی سترانی دڵ بریندااران .. ( لێو ، ماچ ، گوڵ ، پەپولە، ملوانکە ، راز ، خەون ، پەیمان ، زوڵف ، هەناسە ، خەندە ، سینە ، ئامێز ، گەردن ، حەز ، شەو ، ئەستێرە ، فرمێسك ، ناز ) رستێ
زەنگیانەی رەنگاو رەنگن و ئاوێنەی خەیاڵی ( گەردین ) یان نەخشاندووە..
لێرەدا جێی خۆیەتی بە تیشکێ سەرنج جیهانی شیعر و هەست و دەرونی ( گەردین ) رۆشن بکەینەوە.. ئەو جیهانە تاو نا تاوێك ژوورێکە پی لە بێدەنگی و تەنیایی، پڕ لە تریفەی مانگە شەو، پڕ هەناسەی دڵنیایی .. تاو نا تاوێکیش شەوگارێکە پڕ لە ئاوازی تۆران و پڕ داستانی پەشیمانی، پڕ لە فرمێسکی دابڕان پڕ لە گریانی جودایی.
لە هۆنراوەی ( ملوانکە ) دا لە وێنەیەکی ئەفسوناویدا باس لە چەند ساتێکی خەندە ئامێز دەکات و دەڵێ:

**ئەو ئێوارەی**

**تۆ لەلام بووی**

**گوڵم هێندە دڵم خۆشبوو**

**ئاهەقم مەگرە ئەزیزم**

**گۆنای جوانترین فریشتەم**

له سەر كۆشبوو

نەخشاندنی وێنەی ناسکی شاعیرانە لای ( گەردین ) تیشکی خۆری بەهرەیەکی پڕشنگدارە، هەروەك لەم کۆپلەیەدا بەهرەمەندانە وێنەیەکی جوانی نەخشاندووەو دەڵێ:

تۆ دەتزانی

دەبم بە پەلە هەورێك و

لە پای باران

شادی بۆ تۆ

نەبارێنم

گەر وێنەی شیعری وەك گەڵای سەوز درەختی هۆنراوە بڕازێنێتەوە ئەوا ( خەیاڵ ) وەك شنەبا سەما بە باڵای درەختی هۆنراوە دەکات.

لە هەوارگەی خەیاڵی شیعریشدا ( گەردین ) هەستیارانەو بە شێنەیی چیرۆکی خۆشەویستی خۆی بە ئامێزی جیهانی خەیاڵی ناسك دەسپێرێ و لە هۆنراوەی (ئەم شەو) دا دەڵێ:

ئەم شەو من و

ئەو وێنە یە

کە تۆ بەدیاری پێت دابووم

قسە دەکەین

من بە شیعر

ئەو بە نیگای چاوەکانی

لە یەك دەکەین

هۆنراوەی جوان هەمیشە لە ناخی خۆیدا شمشاڵی مۆسیقای جوان دەژەنێ..

( گەردین ) ی دڵتەڕ لە هۆنراوەی ( لێوی تەڕ ) بە چاپۆکی پەنجەی حەزی دەخاتە سەر شمشاڵی مۆسیقای جوان و دەڵێ:

**ئەگەر ڕۆژێ**

**شەپۆلی ماچ**

**هاتە وەستان**

**کێڵگەی لێوی ووشک کردم**

**وەرە شیلەی دەریای لێوت**

**بکە باران**

**بەسەر لێوما ببارێنە**

**خونچەی حەزم**

**لە سەر لێوی خۆت بڕوێنە**

زمانی شیعر زمانێکە هەمیشە پاراو هەمیشە سادەو ڕەوانگۆ، لای ( گەردین ) ئەوکاتە زمانی شیعر پاراوتر دەبێ کە بە ووشەی ڕسکاو و جوان پۆش پەرژینی باخچەی هۆنراوە هەڵدەچنێتەوە.. لە ( ڕەشماڵی خەم ) دا دەڵێ :

**تاکەی ڕەشماڵی خەمەکان**

**لە هەواری دڵی منا**

**هەڵدەدیت و**

**دەمکەی بە چیخی چوار دەوری**

**ئەو ڕەشماڵە**

**ئیتر بەس بێ**

**گوڵی خۆزگەم تینو مەکە**

**ڕێگە بدە**

**ببمە باخەوان ئەم ساڵە**

**باچیتر تینووی دەست نەبن**

**ئەو دوو سێوو**

**پرتەقاڵە**

# لێوی تەڕ

ئەگەر ڕۆژێ
شەپۆلی ماچ
هاتە وەستان
کێڵگەی لێوی وشک کردم
وەرە شیلەی دەریای لێوت
بکە باران
بەسەر لێوم ببارێنە
خونچەی حەزم
لەسەر لێوی خۆت بڕوێنە
هەرچەند دەکەم
لێوی تەڕت
لە پەڕەی گوڵ ناسکترن
دڵم نایە ئازاریان دەم.
کەدەشزانم
زۆر لە هەنگوین شیرین ترن

# نامە

سبەی شەوێ

نامەیەکت بۆ دەنێرم

تیای دەنوسم

ئەوەی کەدڵ داوایەتی.

من بە قات و بۆینباغ و

تۆ بەتاراێ

بوکێنیەوە

بمانگرتبا وێنەی بووک و زاوایەتی

١٥-١١-٢٠٠٦

# لافاو

دێته بیرت

له گۆڤەندی هاوڕێیەکمان

من و تۆ یەکترمان ناسی.

لەو کاتەوە

لافاوی عەشقت هەڵی کرد

دڵی بەسەزمانی بردم

لەجەژنی "ڤالانتاین"یش

چاوەڕوان بووم.

تۆ ئەوەندە دڵت ڕەق بوو

گوڵێکت پێشکەش نەکردم

١٤-١١-٢٠٠٦

# هەنــگوین

بە بیرت دێ

تۆ پێت وتم

هەرچی دەکەم

هەزار بزەو خەندە دەکەم

وا هەست دەکەم

لە بەرامبەر دڵی تۆیا

شیرین نابم

نەتزانی لێوت هەنگوینە

هەتا بیخۆم لێی تێرنابم

تەموزی ٢٠٠٥



خۆزگـــەم بە خاڵێ کــەوابەم شێوە

خــوا بەخشیویەتی بەم جــووتە لێـوە

ئەگەر لە جێگای ئەو خاڵە دەبووم

لــە مژینی لێو قـەت تێر نــەدەبووم



# وێنە

ئەو وێنانەی
تۆ بۆت ناردووم
یەکە یەکە
لەناو ئەلبومی دڵم دا
هەڵم گرتوون
ئەو شەوانەی بۆت گریاوم
سەدان دڵۆپە فرمێسکم
لە سەر ڕشتوون
دڵۆپ دڵۆپ
شوێنی هەموو فرمێسکەکانم
هەرماون
لەسەر ئەو دوو لێوە تەڕەی
هەزاران شەو
هەڵم مژتوون

٩-١٢-٢٠٠٢

# خەم

لەو کاتەی کە
بۆیەکەم جار
دایک گۆپکە مەمکی خۆی
خستمە زار
کە یەکەم رۆژ
لەگەڵ هەناسەی دایک دا
خونچەی چاوەکانم
پشکووت
لەو کاتەوە
خەم تەنگی پێ هەڵچنیوم
ناوێزانی بەژنم بووە
لە هەر جێ بم لەگەڵ منە
تەنها چەند میلێکمان بەینە
بۆیە خەڵک وانەزانێ
من لە گەڵ خەم
وەک دوو برای دووانەینە

٢٨-١١-١٩٩٨

# هێندە شیرنی

هێندە شیرنی
نەڵێی
لە ناو دەریای هەنگوینا
هەڵێنجراوی
لە قوڵایی هەزار مەتر
هەرکاتێکی ماچت دەکەم
زۆر شیرینتری لەشەکر
بۆنی زوڵف و
پەرچەمیشت
دەبڕی ڕێگای
هەزارەها کیلۆمەتر
بەقوربانی
یەک تاڵەمووی پرچی تۆبێ
سەدان تەن
کوڵاوو عەتر

٧-٥-٢٠٠١

# دڵێکی شێت

دڵێکی شێتانەم

هەیە

کە گرۆەی گرت

ژیر بوونەوەی

نەبێ بەخەم.

هاوار دەکا و

هەر دەگریێ

بێدەنگ نابێ

هەتا مەمەی نەخرێتە دەم

٤-١٢-٢٠٠٠

# چوار وەرزی ساڵ

من ئەوەندە تۆم خۆشدەوێ
چوار وەرزی ساڵ ئاگام لێتە
بۆ کوێ بڕۆی
وەکو سایە بەدواتەوەم
چاوم لێتە
لە هاویندا
خۆمت بۆ دەکەم بە چەتر
لە تیشکی خۆر دەتپارێزم
تا ئارەقە نەکا لەشت
ئەو کاتەی دێیتە ئامێزم
لە زستاندا
وەک پەڕتوکی شعرەکانم
داتدەپۆشم
تا سەرما ئازارت نەدا
ئەو دەمانەی
کەسەر دەخەیتە سەر کۆشم

لە پایزدا

چەکی بەرەنگار بوونەوە

نەکەمە شان

نابێ گەڵای

خۆشەویستیت هەڵوەرێنێ

نەکەومە جەنگ

لەگەڵ خەزان

لە بەهاردا

هێشوە ترێی

بەبەر بەژنت پاوان دەکەم

لە پێناوی ئەوینی تۆ

سەدان قەتڵ و تاوان دەکەم

٢-١٢-١٩٩٩



شوشەی پەنجەرەی دڵـم شـــــکاوە

تۆ بە دەســتی خۆت تیرت لێ داوە

ئەو دڵەی کە وا حەشارگەی تۆ بوو

ئێســـتا بـــێ بینە گۆمـــی خوێناوە





بۆ هەر لابچی، بۆکام لابڕۆی

بە هەزاران داو دانێمە بەر پێیت

لە هەر ڕێگایێ تۆی پێدا دەڕۆی

دەسک و داوی من دەکەوتە سەر ڕێت



# عەشق

ئازیزەکەم.

لەو کاتەی تۆ

لەناو بێشکە دابووی.

بە دەنگی پڕ سۆزی دایکت

بوویتە هۆگری لای لایە

لەو کاتەوە

عەشقی چاوی جوانی تۆبووم.

دڵم بۆتە ئەلبومێک و

وێنەی جوانی تۆم لەلایە

کە گەورەبوویت

عەشقی منیش

وەک گەڵا مێو

لە باڵاکەی تۆ ئالایە

چاوەڕوانی فەرمانتە

یا مردنم

یا خود شاد بم

لەگەڵ ئەو بەژن و باڵایە

٧-٦-١٩٩٧

# تۆ دەتزانی

تۆ دەتزانی
کەشتی حەزم
بەرەو دەریای عەشقی تۆ دێت
خۆری هیوام
لەسەر ئاسۆی خۆشەویستی
تۆدا هەڵدێت
تۆ دەتزانی
من بە تەمام.
یەکەم گوڵی خۆشەویستی
لەناو باخی دڵی تۆدا بڕوێنم
یەکەم وشەی
عەشق و ئەڤین
هەر لە گەڵ تۆ بدرکێنم
تۆ دەتزانی
لە یەکەم ژوان
لێوی وشکم لەگەڵ لێوی پڕ سۆراوت
ئەنا سێنم
تۆ دەتزانی
دەبم بە پەلە هەورێک و

ه پای باران

شادی بۆتۆ

ئەبارێنم

تۆ دەتزانی

بۆ تۆ دەبمە ئاورینگی خۆر

گەرمی بۆ باوەشت دێنم

بە پڕشەنگی تیشکی گەرمم

هەرچی خەمی ئاخت هەیە

ئەی سوتێنم

تۆ دەتزانی

ئەوەندە ئاشقی تۆمە

ئامادەمە

دڵی خۆمت بۆ دەربێنم

بەڵام گیانە

تۆی بێوەفا

لە گەڵ هەموو ئەو عەشقەم دا

بێ وەفا بووی

ئەت هێشت حەزو ئارەزووەکان

بۆ ساتێکیش

لە گەڵ تۆدا بەدی بێنم

١١-٦-١٩٩٧

# توڕەیی

له نامەیەكتا نوسیبووت

ئەم جارە خۆم دەسووتێنم

ئەگەر چیتر دوابكەوی

بەڵام كچێ

من دڵنیام دەیان جاریش

دوابكەوم

هەرناتوانی

ئاگر لە جەستەی خۆت گڕدەی

من و تۆ یەكتریمان

زۆر خۆشدەوێ

ناتوانی وا بە ئاسانی

دەست لەو خۆشەویستیە بەر دەی

١٠-٣-٢٠٠٦

# ئاوێنە

زۆر هەوڵم دا

ببی بە لەتێ ئاوێنە

هەردەم لە ژوور سەرم دابی

خەمت بکەم

بە پۆشاک و

شەو و رۆژ لە بەرم دابی

نەم زانی کە وا دڵی تۆ

لە هەموو بەردێ ڕەقترە

بە دڵی من

نەرم نابی

٥-٢-٢٠٠٧

# بڕیار

کە دەتبینم
لەناو چاوت
بیرم نەچێ بڕوانمە
قژی خاوت
بۆیە وا بڕیارم داوە
ئەم جارەیان
بە کامێرای تیشکی چاوم
وێنەت بگرم
لە کەناڵی سەتەلایتی دڵم دا
پەخشت دەکەم
کە هاتمەوە
لە شاشەی تەلەڤزیۆنی
ژوورەکەما
سەیرت دەکەم



له دووری یەکین وەک زەوی و ئاسمان

بۆیە نەماوە هیچ دەنــگ و بــاسمان

هەرچەند بەجەستە لە یەکتــر دوورین

بەڵام وابزانە لەناو یــەک ژوورین



# ئەگەر بڕۆی

لەو ڕۆژەی
بڕیارت داوە
سەفەر بکەی
ئەو دڵەم پەرێشانە بۆت
ئەگەر بڕۆی
وەک منداڵ بەدوات ڕادەکا
هەردەم چاو بەگریانە بۆت
یان واز لەم سەفەرەت بێنە
یاچیتر نازاری مەدە
ئەویشیان بەرە لەگەڵ خۆت

٢-٢-٢٠٠٧

# كە دێیتە لام

کەسێک نیە

سێبوری دڵ بداتەوە

ئەو شەوانەی کە بە تەنیام

لە گەڵ وێنەو نامەکانت

بۆ خۆم ئەدوێم

خاوەن هەزار خۆزگەو بریام

ئەو کاتانەش

زەماوەندی شادی دڵە

کە دێیتە لام

حەز ئەکەم بتکرمە ئامێز

(ئەوەندە شیرینی لەلام)

٢٠٠٧/٢٠٠١

# خەون

کە تۆ هاتی

لەگەڵ خۆتا

بارگەی خەمت

بۆ من هێنا

وتت دوا جارەدەتبینم

کە ڕۆیشتی

دڵمت لە ڕیشە دەر هێنا

ئەم زانی خەونە دەبینم

٢٠-١-٢٠٠٧

# بەندیخانە

ئەگەر ژووری
خەوتنی تۆ
کرابوایە بەندیخانە
منیش وەکو فریشتەکان
بێ گوناهبام.
ڕۆژێ سەد تاوانم دەکرد
لەم جیهانە
بەس بۆ ئەوەی
تا دەبەندیخانە دەکرام

٣٠-١-٢٠٠٧



با خۆشەویستیت تینم بۆ بێنی

وەک گڕی ئاگر دڵ بسووتێنی

کە لێوی تەڕت گەیی بە لێوم

ئیتر ئەم گڕە تینی نامێنی





وادەو پەیمانم وا بەتۆ داوە

هەتا هەناسەم لەبەردا ماوە

گەر دڵ بوەستێ لە کوتەولێدان

دەنا ئەستەمە دەست لەیەک بەردان



(.....)

کەر

ێسکی چاوی تۆ

بە دەریا

ش دەبم بە ماسی گر

گەر کوورەی باخەڵێشت

د نەوەندە سووربێتەوە

یدادەبم بە ئاسنگر

نیام کەنام سووتێنێ

کە گوڵم

منداڵی فێرت کردووم

ست درێژ بکەم

ئاگر .

٣١-١-٢٠٠٧

# بۆ پشكنین

ئەگەر تۆ دکتۆرە دەبووی

بۆ دیدەنیت

ئەوەندە بە پەرۆش دەبووم

هەربۆ ئەوەی بم پشکنی

رۆژی سەد جار

نەخۆش دەبووم

٢٠-١-٢٠٠٧

# دەرگای دڵم

لە دوای تۆ

دەرگای دڵی خۆم.

دادەخەم

کلیلەکەی

تووڕ دەدەمە ناو هەگبەی خەم

لە سەر دەرگا

لافیتەیەک هەڵدەواسم

بە هیمۆ گلۆبین دەنووسم

ئەو دەرگایە

بۆ هیچ کەسێ ناکرێتەوە

تا هەتایە

٢٠-٣-٢٠٠٠

# تۆران

حەیامێکە کەدەتبینم

وا هەست دەکەم.

تۆ گۆڕاوی

وەکو جاران رووت گەش نیە

راست پێم بڵێ

ئەگەر تۆ لەمن تۆراوی

گرینگ نیە

لێم بتۆرێی یا نەتۆرێی

هەموو کاتێک

تۆ بۆمن وەک نان و ناوی

٢٩-١-٢٠٠٧

# ڕەشماڵی خەم

کەی شەپۆڵی عەشقی تۆ

ەناری دەریای حەزی من

ارمێنێ

اکەی دەریای ئەشکی خەمم

اوەڕوانی

اسیە سەوز ڕەنگەکانی

یگایەکی چاوی تۆبن

اکەی ڕەشماڵی خەمەکان

لە هەواری دڵی منا

هەڵ دەدەیت و

دەمکەی بە چیغی چوار دەوری

ئەو ڕەشماڵە

ئیتر بەس بێ گوڵی خۆزگەم

ئینومەکە

رێگە بدە

ببمە باخەوان ئەم ساڵە

باچیتر تینوی دەست نەبن

ئەو دوو سێو و

پرتەقاڵە

١٤-٥-٢٠٠٠

# نیگا

(پێشکەشە بە هاوسەری ژیانم)

نەمامێک بووی

هێشتا با نەی هەژاندبووی

گەڵاکانت

سەرەتای سەمایان بوو.

شکۆفە بووی

نەبوی بە هاوڕێی پەپولە

بە هارێک بووی

لە پایزا بۆ من هاتی

لە یەکەم نیگای نێوانمان

فۆڕمی قسمەت و نسیبمان

واژوکرا

لەو ڕۆژەوە دڵی تۆشم

بەقەد پاڵی دڵی خۆما هەڵواسیوە

جگەلە تۆ دوای خوداوەند

کەسی ترم نەناسیوە

٢٨-١٠-١٩٩٧

# تەماع

زۆر دەترسم
ڕۆژێ دابێ
هەنگاوەکانت سست بکەی
گوێچکەی دۆلار
چاوی پڕ عەشقت کوێر بکا
خۆشەویسی
باڵ نەکێشێ بەسەر گیانتا
تەماع سۆمای چاوت بگرێ و
عەشق لەگەڵ وەرەقەدا
بگۆڕییەوە
زۆر دەترسم
نامەکانم
لە سوچێکی ماڵەکەتا
بەند بکەیت و
دێڕەکانیان نەخوێنیەوە
زۆر دەترسم
ڕۆژێ دابێ
لە تەلارێکی گەندەڵی

ناز بکەیت و

ناوڕ بۆ رابردوو نەدەیتەوە

کۆتایی بەم عەشقە بێنی

یادگارییەکان

لە دەفتەری مێژووی ئەوین

بسڕیەوە

١-٣-٢٠٠٤



پەڵپینت بۆ کەم لەلای مەلایان

هەتا نەبینی دەردوو بەڵایان

تۆ شای جوانانی لە دێ و لەشاران

خوایە بەدوور بی لەچاوو زاران



# گریان

دڵم چیتر بەرگەی نازاری تۆ ناگرێ

خۆزگە تۆم هەر نەناسیبا

کەتۆم ناسی

وڵاتی دڵمت داگیر کرد

وام نەزانی

تۆ فریشتەی

لە هەر کوێ بم لە گەڵم دای

بەڵام ئێستا

وا هەست ئەکەم

تۆ خەریکە

بەبێ ئەوەی سڕم بکەی

دڵم لە سینە دەر دێنی

ڕۆژێ سەد جار

خوێنم دەمژی و

دووسەد جاریش دەم گریێنی

٢٢-٧-٢٠٠٧

# مەلی ڕاز

مەلی ڕازم
لە ئاسمانی خۆشەویستی بێ هەوارە
هێشتا لەسەر گەڵاو پۆپی
هیچ درەختێک نەنیشتووە
هەزارەها درەختیش هەن
باوەشیان بۆی ڕاگرتووە
گوڵم
ئەگەر تۆ حەزبکەی
هێلانەی مەلی ئەو ڕازەم
لە ناو دارستانی عەشقت
دروست دەکەم
لە مابەینی خەرمان بەرەکەتی
لیمۆت
تا سیەکانم هەناسەدەن
ئەنیشمەوە
دڵنیاشم جارێکی تر
باڵندەی حەزی ئەو ڕازەم
بەرەو ئاسمان نافڕێتەوە

٤-٤-٢٠٠٧

# نیگار

خۆزگە نیگار کێش بوومایە
بم توانیبا
وێنەی جوانت
لەسەر پەڕەی دڵ بکێشم
هەتا چیتر
ئەو کاتانەی لێم دوورەبی
بۆ دیدەنیت
ئەوەندە ئاخ هەڵنە کێشم
چونکە گوڵم
هێندە جوانی
تا پێدەچی لە جوانیدا پڕتر دەبی
هەرچەندەکی سەیرت دەکەم
بەخۆم نیە
لە بەر چاوما جوانتر دەبی

١٨-٤-٢٠٠٧

# گۆرانی

ئەم شەو ئەبم
بە پاسارییێک
لەسەر دۆندی دارتووەکەی
ناو حەوشەتان
تۆقرە دەگرم
تا ئەو دەمەی پڕشەنگی خۆر
لە پەنجەرەی ژوورەکەتا
دێتە ژووری
ئەوکات منیش
بە هێمنی گوێ شل دەکەم
لەو گۆرانیەی
کە لەبەر خۆتەوە ئەیلێی
تا لەگەڵ نۆتەی مۆسیقاو
ئاوازەکەی
بە گەرووتا شۆڕ ببمەوە
بۆ ئەوەی لەسەر زاری تۆ
هەموو رۆژێ
سەد جار دووبارە ببمەوە

٢٢-٧-٢٠٠٧

# سەفەر

کە سەفەرێکت دێتە پێش
وا ئەزانم نایێتەوە
سەد خەونت پێوە ئەبینم
تا بۆ لام ئەگەڕێیتەوە
کەتۆ ئێستا لە سەفەری
جەرگی منت برژاندووە
بە دەیان جار هەوری چاوم
بارانی بۆت ڕژاندوە
ئەو کاتانەی سەفەر ئەکەی
ئیلهامی شیعرم بۆ نایە
دێڕێکیشم بۆ نانوسرێ
بە خەیاڵیشم دانایە
وەرەوە بۆ ماڵی شیعرم
خۆ دەرگام دانەخستووە
دەزانم تۆ لە من زیاتر
شیعری منت خۆشویستووە
دەوەرەوە کزەی جەرگم )
بۆ حەز ئەکەی بێ تاقەت بم

ـفتیێ هاتنەوە نەدەی

ی سەد جار بە ساقەت بم )

جارە بگەڕێیتەوە

ن چیتر سەفەر بکەی

خۆم دەچم لە جیاتی تۆ

ـنیش لەگەڵ خۆت نەبەی

٢٨-١٢-٢٠٠٧



چی جـوانی هـەیە ڕوخســاری گــوڵە

تروسکەی هیوای پێنج چاو گەی دڵە

هەرچەندە گەڵای شکۆفەی گەشە

بـەڵام ئاکـامی ئاوێـتـەی گـڵـە



# په پوله‌ی لێو

چی له‌و دڵه شێته‌م بکه‌م
ده‌مێکه عه‌وداڵی تۆیه
ئه‌م شه‌و وه‌ره
بۆ ماڵی دڵ
خۆ دڵی من ماڵی تۆیه
به‌ر له‌وه‌ی به‌ڕێ بکه‌وی
گوڵم په‌یامێک بنێره
هه‌تا ژێر پێی قاچه‌کانت
فه‌رش گوڵکه‌م
هه‌تا نێره
نازیز په‌پوله‌ی لێوی من
زۆر له مێژه
به ده‌مته‌وه نه‌نیشتووه
به دوای شیرینی ده‌گه‌ڕێ
شیله‌ی لێوتی نه‌مژتووه
ئه‌م شه‌و وه‌ره بۆ ماڵی دڵ
ده‌ک گیانم وه‌سه‌رت گه‌ڕێ

با چیتر پە پولەی لێوم
بە دوای شیرینی نەگەڕێ

٢-١١-٢٠٠٧

# ملوانکە

ئەو ئێوارەی
تۆ لەلام بووی
گوڵم هێندە دڵم خۆشبوو
نا هەقم مەگرە ئەزیزم
گۆنای جوانترین
فریشتەم لەسەر کۆشبوو.
ئەو کاتەی
لە گەڵ منا بووی
ئاوێزانی پێکەنین بووی
سەد هێندە زیاتر لەجاران
گوڵم لەلام نازەنین بووی
دڵم خۆشبوو
بەو ڕادەیە
دەگریام و دەمویست
بفڕم
نەم ئەزانی چۆن بتوانم
فرمێسکی دڵشادی بسڕم
پێم ناڵێی کێ بوو

یەکەمجار

پەپولەی ناساند

بە گوڵ

هەتاکو ملوانکەی

زێڕی

هەڵبواسم

بەسەر دڵ

٩-٨-٢٠٠٧

# ئەم شەو

ئەم شەو من و
ئەم وێنەیە کەتۆ
بە دیاری پێت دابووم
قسە دەکەین
من بە شیعر
ئەو بەنیگای چاوەکانی
لە یەک دەگەین
کە تەماشای چاوت دەکەم
نازانم بۆ
ئەستێرە لە چاوت ئەچێ و
ئاسمان لە ڕەنگی تۆ ئەکا
پڕشەنگی خۆر بۆیە گەرمە
گەرمایی لە کوورە خانەی
بەر گەردنت وەرگرتووە
ئەوەندە هۆگری شەو بووی
جوانیت بە تریفە بەخشیوە
تارمایی شەو

ڕەنگی پرچی تۆی گرتووە

شلکە ڕێواس

کە تۆی بینی نیرەیی بە باڵای

بردی

لە چاو تۆوە

بەژنی خۆی ناسک کردووە

دەریایەک نەسرینت

هەڵڕشت

هەور لێت فێرە گریان بوو.

کە منیشت

بۆ وڵاتی پڕ خۆشەویستی

ڕکێشا

لەو کاتەوە

چاوی منیش لە چاوی تۆ

فێرە فرمێسک باران بوو .

٧-١٢-٢٠٠٧

# تۆرانی شیعر

ئەم شەو ئیلهام

تابلۆ و ئاواز

چی سیفەتی شیعر هەیە

تۆراون لێم

پێیان ووتم

ئەم شەو تا خزێینە ئامێزی

وشەو رستەی شیعرەکانت

تا مۆر نەکەی

فۆرمی سۆزو وەفاداری

بۆ نیشتمان

بە ترۆپکی هەر دە پەنجەی

دەستەکانت

٢٠٠٦-١٠-٣١

# ناز

هەقتە بنازی بەو هەموو

جوانیەت

خودا نەوەندە

تۆی جوان کردووە

بە هارو گوڵو تریفەی

مانگیش

کە جوانن ڕەنگی تۆیان

گرتووە

بێ بەزەییانە نازارم

نەدەیت

چ تاوانێکی گەورەم

کردووە

خۆ کە لەو ڕۆژەی

خوا نێمەی خوڵقاند

نەتۆی بۆ من و

منیشی بۆتۆ

دروست کردووە

# پیرۆزبایی

ئازیزەکەم

بە چەند دێڕێک

جەژنە پیرۆزەت لێ دەکەم

ووشەکانت بۆ ئەکەم بە نوقڵانە

دەمی تۆیڕێ شیرین ئەکەم

پێنەکانیش ئەکەم

بە ڕێژنە بارانە

خاکی بێ بارانی دڵت

تێر ئاو دەکەم

ئازیزەکەم

لەم جەژنەدا

من جەژنانەم لە تۆ دەوێ

لە بری نوقڵ و شیرینی

بالێوت بەر لێوم کەوێ

مەپرسە بۆ

گەر شیلەی لێوت ژەهریش بێ

من دەمەوێ

نەزانی بۆ

چونکە گوڵم من تۆم لە خۆم

خۆشتر دەوێ

٢٠-١٢-٢٠٠٧



بە یەک گەیشتن چەند دڵ لەسۆران

هەزارانـــی دیش لـەیەکتـــر تۆران

شـاد نەبـوی لەگەڵ ئەو دڵم هەتا

لـە تـــرپە وەستا لە داخی گـۆڕان



# نوێژی بارانە

زۆر لە مێژە
کێڵگەی لێوم
بۆ بارانی ماچ تینووە
چاوی بزەو خەندەکانم
هەوری ماچیان
لێ ونبووە
هەر چەند لە ئاسمانی
عەشقت
جار جار هەور ئەگرمێنێ
وەلێ خێرا تێئە پەڕێ
بەسەر کێڵگەی
وشکی لێوم نابارێنێ
مەگەر بەرماڵ بخەمە شان
لە تەکیە رووە لە رووگەکەم
بۆ بارینی
رێژنە ماچێک
دەست بە نوێژی
بارانە کەم

٢١-٣-٢٠٠٧

# زۆر لە مێژە

زۆر لە مێژە من بۆ ئەوە هەوڵە دەم

بۆم هەڵكەوێ دەمت بخەمە نێو دەم

چەند خۆشە گەر جارێك بۆمان هەڵكەوێ

سەر بخەمە سەر سینەت نیوەی شەوێ

من كەوا مەحرومی دوو چاوی تۆمە

كێ هەیە لە دونیا بڵێ تۆم دەوێ

ئەگەر دەرگای دڵیشت لێم دابخەی

من هەر دەڵێم تۆم لەخۆم خۆشتر دەوێ

٢٢-١٢-١٩٩٧

# خاتوون

خـــــاتـــوون ئەوەندە ناســـــک و جوانی

باتینگی گوڵی تـــازە پشـــکـــوتـــووی

ئەوەندە نـــازو فـــیزی پـــێ نـــــاوێ

خـــوداوەند ئـــەتۆی هێندە جوان کردووی

ئـــــاقـــــڵ و ژیـــــرو زیرەک و ئازای

وەک پسپۆڕان وای هێندە پێش کـەوتووی

لەگـــەڵ منیشـــا ڕووت هـــێندە گـــرژە

ئـــەڵێی بـــــاپیرم بـــــە چەقۆ کوشتووی

٣-٣-١٩٩٩

# هەرکەس

هەر کەس بیەوێ من و تۆ دوور بـین
هەر یەک لە شوێنێ لەسـەر سنور بین
خوایە وا بکەی بە خۆی دوور کـەوی
بە قەد نێوانی ئـاسـمان و زەوی

******      ******

هەرکەس بیەوێ نێوان مـن و تـۆ
دوور بێ لە شێوەی بانەو تـانجـەرۆ
خودایـە بەخۆی لە خزموو کەسـی
ئەوەندە دوور بێ کەس لێی نەپرسی

******      ******

هـەر کەس بیەوێ من و تۆ هـەردەم
بۆ ساتە وەختێ دانەبڕێین لـە خـەم
خودایە دڵـی ئـەو بـکـەی تـەژی
لە خەم و خەفەت هەتـا دەی کـوژی

******      ******

هەرکەس بە دووری ئێمە دڵ خۆش بێ
ئاگری شەڕی هەردەم لـە جـۆش بێ

لە بڕی ئێمە خوایــە گیـــــانی خۆی

بە ئاگــــری دۆزەخ بســـووتێنی بــۆی

٦-٨-٢٠٠٥

# پەیمان

بـــاڵآت وەک چـــنار بەرز هەڵچـــووە
ســـەدان جار خۆمم لێ نــــاڵآن دووە
چەند جار کەمبڵی لێوانم گـــەزتووی
چەندین جار شیلەی لێوانم مـــژتـــووی
چەندم گوشیوە شەوانی تـــاریـــــک
گەردەنی زەردو ناوقەدی بـــــاریک
چەندین جار لەگەڵ گوشـــینی مەمان
نەرمە نارەقەت دەهات لـــە شـــەرمان
چ بێتارێکت بەســـــەرمــــا هـــێنا
هەتا بۆ یـــاری تـــــۆم وا ڕاهـــێنا
جا چۆن دڵـــــم دێ بـــەبێ تۆ گوڵم
دوور لە چاوی تۆ شـــــاد بکەم دڵم
بە لێن بێ هەتا هەناســـەم مـــــاوە
کەسم خۆشنەوێ لــــە تۆ بـــەولاوە

١٠-٣-٢٠٠٥

# سوپاسو پێزانین

-زۆر سوپاسی هەموو ئەو دڵسۆزانە ئەکەم،کە هاو کاریان کردووم
لە بە چاپ گەیاندنی ئەم بەرهەمە. بەتایبەتی برایانی شاعیر و نوسەر

١- کاك عامر قادر ڕوستایی

٢- کاك دیار ڕواندزی

٣- کاك ڕوبار ڕواندزی

٤- کاك جەمیل بەرزێوەیی

****************************************

سوپاس و پێزانینم بۆ هەموو ئەوانەی کە هاوکاری ( ماددی )یان کردووم
بەتایبەتی بەڕێز کاك ( موحسین ) بەرپرسی ل،ن،ڕواندز.

# پێناسەی نوسەر:

"گەردین" بەرزێوەیی سـاڵی ١٩٧٥ لـە گونـدی بـەرزێوە سـەر بـە قـەزای ڕواندز، لە دایك بووە. ساڵی ١٩٩٧ چووەتە نێو دونیای ئەدەب، دەسـتی بە نوسینی شیعر کردووە. زۆرێك لە شـیعرەکانی لـە گۆڤـارو ڕۆژنامـەکان بڵاوکردۆتەوە. بەشداری لە چەندین کۆڕی شیعریدا کردووە، لـە پێـشبڕکێی شیعریدا ساڵی ٢٠٠٨ لە سۆران پلەی دووەمی بەدەست هێناوە.

ئێـستاش لـە هـەمان گونـد نیـشتەجێیە، خـاوەنی چـوار منداڵـە بەناوەکانی

(فرمێسك، بەڵێن، هانا، گەلا ...)

بۆ هەر ڕەخنەو پێشنیارێکتان، پەوەندی بەم ئەدرێسانەوە بکەن:

Mob:٠٧٥٠٤٦٥٧٥٤١

E-mail : Garden_b@yahoo.com

## (( پێرست ))

ئەگەر تۆ دکتۆرە دەبووی

بۆ دیدەنیت

ئەوەندە بە پەرۆش دەبووم

هەر بۆ ئەوەی بم پشکنی

ڕۆژێ سەدجار نەخۆش دەبووم

2008

ژمارەی سپاردنی (1077)ی بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ساڵی 2008ی دراوەتێ
نرخی (2500) دینارە